

# میر ئیڤانو گورگە بۆر

وەرگێڕانی : بەدران ئەحمەد حەبیب

## سێ قوڵینگی باڵ ڕەش

پیرەمێردێک و دوو کوڕی پێکەوە دەژیان. دەبوایە دوو کوڕەکە سامانی باوکیان بەیەکسانی لەنێوانی خۆیاندا دابەش بکەن. بەڵام کوڕی گەورە هەموو ماڵ و سامانەکەی برد و ڕۆیشت. کوڕی بچووکیش ماڵەکەی بەجێ هێشت و سەری خۆی هەڵگرت. بەڕێگەوە بیرێکی بۆ هات:

«بۆچی هەندێک خەڵک زۆریان هەیە و هەندێکی تر هەر هیچیان نییە؟ خۆزیا بمتوانیایە خەڵک ئاسوودەتر بکەم!»

لەناکاو چاڵێکی گەورەی لەبەر پێی خۆیدا بینی. پەیژەیەک بەرەو بنی چاڵەکە شۆڕ دەبووەوە. لاوەکە بە پەیژەکەدا چووە خوارەوە. چاڵەکە تاریک و نوتەک بوو. دەرگایەکی گەورەی هاتە پێش. لاوەکە دەرگاکەی کردەوە و خۆی لە کۆشکێکی گەورەدا بینییەوە. کۆشکەکە چەندین ژووری هەبوو. کچێکی جوانکیلە لە ژووری هەرە دوایی دانیشتبوو. پرچێکی ڕەشی کەزی شۆڕ و جووتێک گۆنای گوڵڕەنگیی هەبوو. ددانی وەک ڕیزی گەردانەی مرواری بوو. بەڵام چاوەکانی پڕ لە مەترسی بوون. کچە جوانکیلەکە گوتی:





«تۆ لە کوێوە هاتووی؟»

«لەسەر زەوییەوە!» لاوەکە وەڵامی دایەوە.

کچەکە زریکاندی: «بۆچی تا هەتایە لێرە نامێنیەوە؟» ئەمەی گوت و هەستا ڕۆیشت. لاوەکە لچکی شاڵە ئارمووشینەکەی کچەکەی گرت. کچەکە دەرگاکەی کردەوە. بوو بە قولێنگێکی باڵ ڕەش و فڕی. بەڵام شاڵەکەی لەناو دەستی کوڕەکەدا بەجێ ما. لەو کاتەدا ڕووناکیی ناو کۆشکەکە کوژایەوە.

دوا جار، لاوەکە، توانی پەیژەکە بدۆزێتەوە و لەکۆشکە تاریک و نوتەکەکەی ژێر زەوی هاتە دەرەوە.

ئێوارە بوو، لاوەکە بە شەقامی شارێکی گەورەدا پیاسەی دەکرد. شارەکە لەسەر لێواری گۆماوێک هەڵکەوتبوو. گۆماوەکە لافاوی گەورە گەورەی لێ هەڵدەستا. خەڵکەکەی دەیانگوت: «ئەم لافاوە بە فەرمانی کچێکی ئەفسوونبازی چەپەڵەوە ڕوودەدا. هەر کاتێ جوانترین کوڕە لاوی خۆمانی تێ فڕێ بدەین. لافاوەکە دەنیشێتەوە.»

لاوەکە گوتی: «شتی وا نەکەن. من دەچم بەرەنگاری ئەم ئەفسوونبازە چەپەڵە دەبم.» ئەمەی گوت و چووە سەر ئەو کانیاوەی ئاوی گۆماوەکەی لێ هەڵدەقولا.





لەسەر کانیاوەکەدا، کچێکی جوانکیلەی چاو بێ بەزەیییانەی بینی. ئاوی لە گۆزەیەکی زیوینی بێ بنەوە بەتاڵ دەکرد. لاوەکە گۆزەکەی لێ ڕفاند. کچەکە زریکەیەکی لێ هەستا و، بوو بە قولّینگێکی باڵ ڕەش و بەرەو ئاسمان فڕی.

دوای حەوت ڕۆژ لاوەکە هاتە شارێکی تر. خەڵکی شارەکە لە ترس و لەرزێکی بێ وچاندا دەژیان. ئەو مەلە ئاگرینەی لەسەر تاوێرێکی ئەو نێزیکانەدا دەژیا، هەموو ساڵێ دەهاتە سەر شارەکە و دەرد و پەتای بەسەردا بڵاو دەکردەوە.

لاوەکە بە تاوێرەکەدا هەڵگەڕا، سەرنجی ئەشکەوتێکی دا و کچێکی جوانکیلەی چاو بێ بەزەیییانەی بینی. کچەکە هەندێک پەڕی باڵندەی بەسەر و مەچەکیەوە بەستابوو.

کچەکە بە دەرکەوتنی کتوپڕی لاوەکە داچڵەکی و لە ترسانە ئەنگوستیلەکەی فڕێ دا. بوو بە قولّینگێکی باڵ ڕەش و یەکسەر بەناو پەڵە هەورەکاندا ون بوو.









لاوەکە لە گردەکە شۆڕ بووەوە و پەڵە هەورێکی ڕەشی بینی کە بەری هەتاوی گرتبوو. لەسەر لوتکەی هەورەکاندا کۆشکێکی بینی. کۆشکەکە هێندە جوان بوو، لە جوانییا سۆمای چاوی دەبرد. لاوەکە بیری کردەوە:

«خۆزگە بمتوانیایە سەرێک لەم کۆشکە بدەم.» یەکسەر شاڵە ئارمووشینەکە لە کراسەکەیەوە دەرکەوت و بووە پەیژەیەکی درێژی ئەوتۆ بەرەو ئاسمان هەڵکشا. لاوەکە بە پەیژەکەدا هەڵگەڕا. چووە ناو کۆشکەکە و لەناکاو دەنگی باڵی مەلی لە دەرەوەڕا هاتە گوێ. خۆی لەگۆشەیەکدا شێردەوە و سەرنجی ڕاگرت.





سێ قولینگی باڵ ڕەش هاتنە بەر پەنجەرەیەک. پەڕ و باڵیان داماڵی و بوون بە سێ کچی جوانی پرچ ڕەشی کەزی شۆڕی گۆنا گوڵڕەنگی. ددانیان لە ڕیزی مرواری دەچوو. بەڵام ڕەنگ و ڕووی سێ کچەکە زۆر بێ بەزەییانە بوو.

یەکێکیان سکاڵای خۆی کرد و گوتی: «کاتێ گەڕامەوە کۆشکە تاریکەکەم، کوڕێک لەوێ بوو، لەزەوییەوە هاتبوو. شاڵە ئارمووشینەکەی لێ ڕفاندم و ڕۆیشت. شاڵەکەی من سەرچاوەی هەموو هێز و توانایەکم بوو.»

کچێکی تر چیرۆکی گۆزە ئەفسووناوییەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە و، سێیەمیش چیرۆکی ئەنگوستیلە ئەفسووناوییەکەی.

لاوەکە هاتە دەرەوە و گوتی: «ئەوە من بووم ئەو شتانەی ئێوەم برد. ئێستا هەموو هێزی جادوویی ئێوەم لەلایە.»

کچە جوانەکان پاڕانەوە: «دەبێ شتەکانمان بدەیتەوە. ئەگەر نا دەمرین،» لاوەکە گوتی: «پاڕانەوە دادتان نادات. من دەمەوێ خەڵک ئاسوودە بکەم. لەبەرئەوە هێزە شۆفارەکانتان نادەمەوە. بڕۆن پێش ئەوەی درەنگتان بەسەردابێت.»

قوڵینگەکان باڵیان کردەوە و فڕین. ئیدی لەو ڕۆژەوە نەیانتوانی خەڵک پەرێشان و نارەحەت بکەن.

# میرئیڤان و گورگە بۆر

هەبوو نەبوو، سەردەمانی زوو پاشایەک هەبوو ناوی بەرەندەی بوو. پاشا سێ کوڕی هەبوون، کوڕە گچکەکەیان ناوی ئیڤان بوو. پاشا ڕەزێکی جوانی سێوانی هەبوو ناوبانگی پێ دەرکردبوو. ڕەزەکە پڕ بوو لە داری سەیر سەیر، سێوی زێڕینیان دەگرت. پاشا گەلێک بە ڕەزەکەیەوە دەنازی. جا بەڕاستی شایەنی پێوەنازین بوو. بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان دزێکیان لێ هەڵکەوت و دەستی بە سێودزین کرد.

پاشا شێت و هار بوو، زۆری پێ ئەستەم بوو ئەو سێوە جوانانەی لەدەست بچن. لەبەرئەوە شەوانە پاسەوانی دادەنا بۆ ئەوەی دزەکە بگرن، بەڵام سێو بەرەو بڕان دەچوو. پاشای تاین لە حەژمەتان چەشکەی نانی نەدەکرد.

کوڕانی پاشا بۆ ئەوەی دڵی باوکیان بدەنەوە، هاتن گوتیان: (باوە خەم مەخۆ، ئێمە خۆمان دزەکە دەگرین.) کوڕە گەورەکەیان گوتی: (ئەمشەو من یەکەمین پاسەوانی دەگرم و دڵنیاشم دزەکە دەسگیر دەکەم.) بەرەبەری ئێوارێ کوڕەکە بەرەو ڕەزەکە چوو. تا ماندوو بوو بەو ناوەدا خولایەوە. پاشان لەسەر نەرمە گیایەکە ڕاکشا و خەو بردیەوە.

بۆ بەیانی پاشا زۆر هەڵوەدابوو بزانێ ئاخۆ کوڕە گەورەکەی دزەکەی گرتووە یان نا! کوڕە گەورەکەی گوتی: (باوەگیان، نەمگرت، ئەمشەو ترووکەیەک چییە نەنووستم، بەڵام کەسم نەبینی).

شەوی دواتر، دووەمین کوڕی پاشا چووە پارێز، بەڵام ئەویش تەبای براگەورەی، ئەو شەوە خەوێکی چاکی کرد. ئەوجا نۆرە هاتە سەر میر ئیڤان، میر ئیڤان باوکی زۆر خۆش دەویست و حەزی دەکرد بە گرتنی دزەکە دڵی خۆش بکا. ئەو شەوە چووە پارێز و گەلێک لێرە و لەوێ خولایەوە. نەدەوێرا





دابنیشێ نەبادا خەو بیباتەوە. میر ئیڤان هەستی کرد خەوە کوتکەی گرتووە، هەستا بە خوناوی چیمەنەکە دەم و چاوی خۆی پاک شوشت. شەو ڕاشکا، میر ئیڤان هەر هێندەی زانی خەرمانە تیشکێک لە ناو ڕەزەکەدا دەرکەوت. تیشکەکە تا دەهات پتر پرشنگی دەدا، سەرتاپای ڕەزەکەی ڕووناک کردەوە. دەتگوت نیوەڕۆیەکی تیشکنی هاوینە. لەناکاو مەلێکی ئاگرین بەبەر چاویدا فڕی و لەسەر لکی ئەو دارە نیشتەوە کە میر ئیڤان پاسەوانەتیی لەپەنا گرتبوو. مەلەکە بە دەندووکان کەوتە هەڵکۆڵینی سێوە زێڕینەکان. میر ئیڤان بە پانەدزکێ لە مەلەکە چووە پێش و پڕی دا کلکی. مەلەکە خۆی لە چەنگی میر ئیڤان ڕاپسکاند و هەڵفڕی، بەڵام پەڕێکی کلکی لەناو دەستی میر ئیڤان بەجێ ما. بۆ بەیانی میر ئیڤان دەستەوهامێز چووە بەردەمی باوکی. پاشا بە بۆرە هیوایەکەوە گوتی:

(کوڕی خۆشەویستم، هەرنەبێ دزەکەت بینی؟)

(بەڵێ بینیم. هەرچەندە پێم نەگیرا، بەڵام نیشانەیەکی بچووکم دەست کەوت. ئەویش ها ئەو پەڕە کلکەیە. وا دیارە دزەکەی ئێمە مەلێکی ئاگرینی جوانە!)

پاشا بە دڵێکی خۆشەوە لە پەڕە کلکەکە ڕاما، پاشان شادییەکی هەست بزوێنی هاتێ و یەکسەر مگێزی خواردنی گەڕایەوە... پاشا ناو بەناوێک دەستی دەدایە پەڕە کلکە جوانەکە و بە سەرسامی سەرنجی دەدایێ.

ڕۆژێکیان پاشا گازی هەرسێ کوڕی خۆی کرد و پێی گوتن: کوڕە خۆشەویستەکانم، ئەگەر حەزدەکەن باوکتان دڵشاد و سەرفیراز بێ، هەرسێکتان ئەسپتان زین کەن و بکەونە دنیا، بۆ ئەوەی مەلی ئاگرینم بۆ پەیداکەن.

کوڕە کەڵەگەت و ناوشان پانەکانی پاشا، دەستەوهامێز کرنووشیان بۆ باوکیان برد، ئەسپیان زین کرد و بەرەو ئامانج بەڕێ کەوتن. هەرکەسە و ڕێگەیەکی جودای هەڵبژارد. هێندەی نەبرد میرئیڤان گەیشتە پێدەشتێکی









بەرین و هەراو، لەناو ئەو پێدەشتەدا چاوی بە ئالآیەک کەوت، ئەم شتانەی لەسەر نووسرابوو:

(ئەوەی ڕێگەی ناوەند بگرێ، خۆی و ئەسپەکەی دەمرن).

(ئەوەی ڕێگەی دەستەچەپ بگرێ، بە زیندوویی دەردەچێ بەلأم ئەسپەکەی دەتۆپێ).

ئەم بۆرە هیوایە میر ئیڤانی سەرپشک کرد، بۆیێ ملی ڕێگەی دەستەڕاستی گرت و ڕۆیشت. تا پێی کرا ڕۆیشت بەلأم سۆرە گەرمای هەتاوی هاوین زۆری تین بۆ هێنا و لە پەلوپۆی خست. میر ئیڤان هەڵویستا بۆ ئەوەی تاوێک پشوو بدا. لە ئەسپەکەی دابەزی و لای دایە سەر نەرمە گیایەک بۆ ئەوەی سەرخەوێک بشکێنێ. تەواوێک نووست – پاشان کە بەئاگا هات ئەسپەکەی نەمابوو. ئەم لا ئەسپ ئەولا ئەسپ، شوونی هەڵگرت ها لێرە ها لەوێ تا گەیشتە سەر کۆمەڵێ ئێسک و پرووسکی ئەسپە نازدارەکەی. میر ئیڤان زۆری سوو لە ئەسپەکەی بووەوە، دڵتەنگ بوو، چۆن ئەم هەموو ڕێگەوبانە بەبێ ئەسپ ببڕێ؟ (بەپێیان)؟ بەلأم ئەرکێکی بەپەلەی هەیە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت (بەپێیان؟ بەپێیان؟ دەی با وابێ!)

ملی ڕێگەی هەڵەمووت و دژواری گرتەبەر و ڕۆیشت. تا هێزی لەبەر بڕا ڕۆیشت. ئیدی پەکی کەوت و هەنگاوی لەدوو نەهاتن. لەسەر سەوزەگیایەکی نەرم و شل ڕاکشا و بیری لە چارەی کلۆڵی خۆی کردەوە. لەناکاو گورگێکی لێ پەیدا بوو، گورگەکە تەپ و کوت بۆ لای وی دەهات.

(بۆ وا خەمباری میر ئیڤان؟) گورگە بۆر پرسیاری لێ کرد.

میر ئیڤان گوتی:

(بە دەردی خۆمەوە دەتلێمەوە، گورگە بۆر! ئەسپە خۆشەویستەکەم لەدەست چووە).

(بەداخەوە، میر ئیڤان، من ئەسپەکەتم خوارد، زۆرم سووە. پێم بڵێ بۆ وا لە ماڵ دەرکەوتووی؟ بەدوای چیدا وێڵی؟) گورگە بۆر پرسیاری کرد.



(باوکم بۆ پەیدا کردنی مەلی ئاگرینی ناردووم.)

(ئەی هاوار!) گورگە بۆر هاواری لێ هەستا. (ئەو ئەسپەی تۆ بە سێ ڕۆژانیش ناتگەیەنێتە هێلانەی ئەو مەلە. تەنیا من دەزانم مەلی ئاگرین لەکوێ دەژی. ئەسپەکەی تۆم خوارد لەبەر هەندێ شەرمەزارم. دەبمە پاکاری دڵسۆزی تۆ و دەتبەمە لای هێلانەی ئەو مەلە. سواری پشتم بەو توند خۆت بگرە.) میر ئیڤان خۆی هەڵدایە سەرپشتی گورگە بۆر و وەک تیر بۆی دەرچوون. بەناو دارستانی سەوزی شین باو، بەسەر گۆماوی بە بریسک و باسکدا ڕۆیشتن. گورگە بۆر کلکە کولکنەکەی کردبووەوە و وەک گەسک بە ئاستەم لە ئاوی گۆماوەکانی دەخشاند. تا گەیشتنە بن شوورەیەکی بۆز و بڵندی قەڵایەکی بەردین. (میر ئیڤان چیی پێ گوترابوو وای کرد. بە دیوارەکەدا هەڵگەڕا و خانووە بچووکەکەی بینی. هێلانە زێرینەکە لەسەر لێواری پەنجەرەی خانووەکەدابوو و مەلی ئاگرینی تێدابوو. مەلەکەی دەرهێنا و لەگیرفانی کورتەکەکەی شێردەوە. لە گەڕانەوەدابوو، چەندی کرد نەیتوانی هێلانەکە بەجێ بێڵێ. دیمەنی هێلانەکە چەندی بڵێی جوان و دڵگر بوو! چۆنی بەجێ بێڵێ؟ ئامۆژگاریی گورگە بۆری لەبیرکرد، دەستی بۆ هێلانەکە برد و نەبرد، هەر هێندەی زانی هەرا و زەنایەکی ئەوتۆ هەستا نەبێتەوە، میر ئیڤان لەترسانە داچڵەکی. زیرەی زوڕنا و ڕمبەی دەهۆڵ پاسەوانانی بەئاگا هێنا و، هاتن میر ئیڤانیان لەجێوە گرت و پەلکێشیان کردە بەردەمی (ئەفرۆن) پاشا. ئەفرۆن پاشا لەڕکانا چاوی پەڕیە پشتی سەری، نەڕاندی: (تۆ کێی کوڕە؟ لەکوێوە هاتووی؟)

میر ئیڤان لێی زیت بووەوە: (من میر ئیڤانم، کوڕی بەرەندەی پاشام).

(مخابنە شازادە دزی بکەن!)

(جا چییە؟) میر ئیڤان بەرتەکی دایەوە. (مەلە ئاگرینە جوانەکەی تۆش سێوە زێڕینەکانی ئێمەی دزیوە!)

شا ئەفرۆن بڕێک هێور بووەوە، پاشان گوتی: (ئەگەر وەکو پیاوان بهاتایەی

و پێت گوتبام ئەوا بەوپەڕی ڕێزەوە مەلەکەم پێشکێشی بەرەندەی پاشای خاوەن شکۆی باوکت دەکرد. دەبڕۆنێ ئێستا چ واتەوات و دەمگۆیەک دەکەوێتە ناو شار و چ بەیت و بالۆرەیەک هەڵدەبەسترێ! باشە، من لێت دەبوورم ئەگەر بێو چاکەیەکم لەگەڵدا بکەی. دەتنێرمە پاشانشینێکی دوور، بۆ ئەو هەرێمەی (کوزمان) پاشای تێدا ڕۆنیشتووە. لە تەویلەکەی کوزمان پاشادا ئەسپێکی یاڵ و بژ زێڕینی زۆر جوان بەستراوەتەوە. ئەگەر توانیت ئەو ئەسپە بدزی و بۆمی بێنی، ئەوا منیش لە برێتی ئەوە مەلی ئاگرین و هێلانەکەیت دەدەمێ!)

میر ئیڤان، ڕێ و ڕاست گەڕایەوە لای گورگە بۆر.

(پێم گوتی دەست نەدەیە هێلانەکە بەڵام بەگوێت نەکردم!)

میر ئیڤان کەوتە پاڕانەوە: (بمبوورە، هاوڕێی خۆشەویستم. جارێکی تر شتی وا ناکەم.)

(گوێ مەدێ، سواری پشتم بە چارەسەرێکی بۆ دەدۆزینەوە.)

میر ئیڤان خۆی هەڵدایە سەر پشتی گورگە بۆر و بۆی دەرچوون، چیا و نەواڵیان بڕی، دەشت و پێدەشتیان بڕی. چەند شەو و چەند ڕۆژان ڕۆیشتن تا گەیشتنە بن دیواری ئەو قەڵایەی ئەسپی یاڵ و بژ زێڕینی تێدا پارێزرابوو. گورگە بۆر فەرمانی دا: (میر ئیڤان بەم دیواری قەڵایەدا هەڵگەڕێ، پاسەوان تێکڕا نووستوون. گورگە بۆر چۆنی گوتبوو کتومت ئاوها بوو – میر ئیڤان چووە ناو تەویلە و ئەسپەکەی گرت. بەڵام چەندی کردی نەیتوانی چاو لەسەر ڕێشمەکەی هەڵگرێ. ڕێشمەکە سەرانسەر بە زێڕ و بەردی گرانبایی نەخشابوو. دیارە ئەسپێکی بەناز پەروەردە بوو!

میر ئیڤان هەر کە دەستی بۆ ڕێشمەکە برد، ئیدی بە زیڕەی زوڕنا و ڕمبەی دەهۆڵ و بە هەراوزەنای پاسەوانان کەڕ و کاس بوو. میر ئیڤانیان گرت و بۆ پێش کوزمان پاشایان ڕاپێچ کرد.

کوزمان پاشا نەڕاندی: تۆ کێی؟ لەکوێوە هاتووی؟

(من میر ئیڤانی کوڕی بەرەندەی پاشام.)





(میـر ئیڤان؟ ئەسـپان دەدزێ؟ تەنانەت جووتیـارێکی کەم ئاوەزیش هێندە گەوج نابێ! باشە، باشە، دەتبوورم ئەگەر پیاوەتییەکم لەگەڵدا بکەی. (داڵمات) پاشا کچێکی جوانی هەیە – یەلینای مەزەداری پێ دەڵێن. ئەگەر ئەو کچەم بۆ هەڵگری و بیهێنیتە ئێرە، ئەوا ئەسپەکە و ڕێشمەکەیت دەدەمێ.

میـر ئیڤـان بەدڵی پڕ لە خـەم و پەژارەوە گەڕایـەوە کن گورگە بۆر و دەرد و کەسەری دڵی خۆی بۆ هـەڵڕشت.

(پێم گوتی دەست بۆ ڕێشمەکە نەبەی، بەڵام بەگوێت نەکردم، تاوانی خۆتە.)

(تکایە بمبوورە!) میر ئیڤان ناورایەوە.

(باشــە دەتبـوورم،) گـورگـە بۆر دڵی نـەرم بوو. (سـواری پشـتم بـە با بەڕێ کەوین...)

میـرئیڤـان خـۆی هەڵدایە سـەرپشـتی گورگە بۆر و بۆی دەرچوون. ڕۆژێک و دووان، شــەوێک و دووان، تا گـەیشـتنە مـیـرنشـینە دوورە دەسـتـەکەی داڵـمات پاشـا. ئەو کاتە یـەلینای مـەزەدار لە باخچەی قـەڵادا پـیاسـەی دەکرد. پاکار و کـەنیـزەک لە چواردەوری هـاڵابوون. گـورگـە بۆر گـوتـی: (مـیـر ئـیڤـان، ئـەمـجـارە بڕوات پـێ نـاکـــەم. لەبـەر هـەنـدێ من دەچـم و تـۆش بگـەڕێوە مـــاڵـێ، پاشـــان دەتگـەمـێ.)

ئیدی میر ئیڤان چۆنیان پێ گوتبوو وای کرد و بەرەو ماڵ گەڕایەوە. گورگە بۆریش بە کـەڵەمـبازێک لە دیواری قـەڵا ئـاودیوو بوو – لە نێـزیک ئەو شـوێنـەی شـازادە پیـاسـەی لەگەڵ دەست و پێوەندان دەکرد، خـۆی لـەپەنا دار و دەوەنان شێردەوە. لە ناکاو گورگە بۆر لەپشتەوە پەلاماری شازادەی دا و لەناو کەنیزەک و پاکارانی ڕاڕفـاند و هـەڵی دایە سـەرپشتی خـۆی. هێندەی چاو بتروووکێنی لە دیواری قــەڵای ئاودیوو کـرد. مـیـر ئـیـڤــان ملی ڕێگـەی گـرتبـوو بەرەو مــاڵ دەگەڕایەوە، هێندەی نـەبرد گورگە بۆر بەخـۆی و یەلینای مەزەداری سـەر پشتی گەیشتنێ. میر ئیڤان لە خـۆشیانە گەشـایەوە. گورگە بۆر فەرمـانی دا: (خێرابە خـۆت هەڵدە سـەر پشتم، پێ دەچێ سـەریان لەدووتابین.)









گورگە بۆر بە کلک ڕاوەشاندنێک بە ئاسمان کەوت. میر ئیڤان و یەلینای مەزەداری لەسەر پشت بوون، دەتگوت بایە. ڕۆژ بەڕۆژ، شەو بەشەو ئاسمانی تەی دەکرد. بەسەر دارستان و لێڕەواران، بەسەر گۆم و ڕووباران، کلکە کولکنەکەی کردبووەوە، وەک گەسک لێی دەخشاندن. تا گەیشتنە هەواری میرنشینی کوزمان پاشا. بەڵام میر ئیڤان لەجیاتی شادی، خەمی لەدڵ بار بوو.

گورگە بۆر گوتی: (چی ڕووی داوە میر ئیڤان؟)

(چی بڵێم گورگە بۆر، چەندی سەر دێنم و سەر دەبەم نازانم چۆن یەلینای مەزەدار بە ئەسپێک بگۆڕمەوە. چۆن شتی وا دەبێ؟)

(خەمت نەبێ میر ئیڤان، مەگەر گورگە بۆر نەبم دەنا نایەڵم ئەو کچە جوانەت لەدەست بچێ. دەیشێرینەوە. من دەچمە کڵێشەی یەلینای مەزەدار و تۆش بۆ کوزمان پاشام ببە.)

یەلینای مەزەداریان لە زنجێکی نێو دارستانێک شێردەوە. گورگە بۆر کەڵەمبازێکی دا و هەستایە سەر پاشوو. کتومت چووە شێوەی یەلینای مەزەدارەوە و میر ئیڤان بۆ کوزمان پاشای برد. کوزمان پاشا لە خۆشیانە شاگەشکە بوو و گەلێکیشی سوپاس کرد، وەک چۆن بەڵێنی دابوویێ – ئەسپی یاڵ و بژ زێڕین و ڕێشمەکەی دایە دەستی.

میر ئیڤان خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکە و گەڕایەوە دارستان بۆ لای یەلینای مەزەدار. لەوێش یەلینای مەزەداری هەڵدایە پاشکۆی ئەسپەکەی و بەرەو ماڵ ملی ڕێگەی گرت.

لەولاشەوە کوزمان پاشا بەخۆکەوتبوو، سەرگەرمی مارە بڕین و گواستنەوەی یەلینای مەزەدار بوو. زەماوەند و شایی ئەو ڕۆژە تا ئێوارە درێژەیان کێشا. کوزمان پاشا ئێوارێ دەستی بووکی گرت و بردیە پەردەوە، لەناو جێ ئاوڕی لە بووک دایەوە چ ببینێ، زەردەخەنەی گورگێکی بۆری هاتە بەرچاو. کوزمان پاشا زێڵکی ڕژا و لە هۆش چوو. گورگە بۆریش وەک تێسکەی

تفەنگ بۆی دەرچوو.

هێندەی نەبرد گەیشتەوە میر ئیڤان و شازادە. بەڵام وێ دەچوو میر ئیڤان گەلێک مگێزی لەجێ نەبی. گورگە بۆر لێی پرسی: (ها میرم بیر لەچی دەکەیەوە؟)

(برا چەندی بلێی خەمبارم. مخابنە ئەو ئەسپە جوانە بە مەلێک بگۆڕینەوە.)

گورگە بۆر کلکی ڕاوەشاند و گوتی: (تەنگاو مەبە میر ئیڤان، بیر لە چارەسەرێک دەکەمەوە.)

هەر کە گەیشتنە قەڵای ئەفرۆن پاشا، گورگە بۆر گوتی: (ئەسپەکە و یەلینای مەزەدار دەشێرینەوە. من دەچمە شێوەی ئەسپەکە و تۆش بۆ پاشام ببە.)

ئەسپەکە و یەلینای مەزەداریان لە دارستانەکەدا شێردەوە. گورگە بۆر کەڵەمبازێکی دایە ئاسمان و خۆی هەڵدا سەر پاشووان. ئیدی ئەسپی یاڵ و بژ زێڕین لەبەردەمی میر ئیڤاندا ڕسکا.

میر ئیڤان ئەسپەکەی بۆ ئەفرۆن پاشا برد. پاشا بەدەسگیربوونی ئەسپی یاڵ و بژ زێڕین شاگەشکە بوو. بەدڵێکی خۆش – وەک بەڵێنی پێ دابوو مەلی ئاگرین و هێلانەکە لەجیاتی ئەسپەکە دایە میر ئیڤان. میر ئیڤان گەڕایەوە دارستان، یەلینای مەزەداری سواری پشتی ئەسپەکەی کرد، خۆیشی مەلی ئاگرین و هێلانەکەی بەدەستەوە گرت، لێی دا سواربوو و بەرەو ماڵ داکشا.

ئەفرۆن پاشا فەرمانی دا ئەسپەکەی بۆ بێنن، هەر کە ویستی سواری ئەسپ بێ، ئەسپەکە لە شوێنی خۆی بووە گورگێکی بۆر. پاشا لەترسان هەترەشی چوو و یەکسەر لە ئەسپەکە کەوتە خوارێ. گورگە بۆریش دەرپەڕی و هێندەی پێ نەچوو گەیشتەوە میر ئیڤان. گورگە بۆر گوتی: (پێویستە ئێستا بەجێت بێڵم میر ئیڤان، ئیتر ناتوانم لەگەڵت بێم.)

میر ئیڤان لە ئەسپەکەی دابەزی و سێ جاران سەری ڕێز و نەوازیی بۆ گورگە بۆر دانواند.







(با جودابوونەوەمـان لە دڵت نەبێتـە گرێ میر ئیڤان. هێشتـا بەکەڵکت دێم.) گورگە بۆر گوتی.

میـر ئیڤـان سـەرسـام بوو. لـە دڵی خـۆیدا گـوتی: (بە کەڵکی چیی ترم دێی گـورگــە بۆر، تۆ هــەمــوو نیــازێکت بۆ بەدی هێنـام.) بەڵام وەک پیـاوێکی ژیر بیرەکانی لە دڵی خۆیدا هێشتەوە.

میر ئیڤان سـواری ئەسپی یاڵ و بژ زێڕین بوو و جـارێکی تر بەڕێ کەوتەوە. نیوەڕۆ گـەیشـتنە کـەوشـەنی میـرنشـینی باوکی. میـر ئیڤـان بڕیاری دا تاوێک پشـوو بدەن. لە ئەسپـەکەیان دابـەزین. لەتە نانێکیـان پێ مـابوو زۆر بە لەزەتەوە خواردیان و ئـاوی کانیـاویان بەسـەردا کرد. لەسـەر گـیـایەکە ڕاکشـان تاوێک بنوون. میر ئیڤان لە شیرینیی خـەودا بوو، برایەکانی گـەیشتنە سـەری. گەلێک ئەم لاو ئـەولایان کــردبوو، دوور و نێــزیک ڕۆیشـــتــبــوون، چووبـوونە وڵاتـانی هـەندەران، بەڵام هیچیان بە هیچ نەکردبوو و بە دەستی بەتاڵ گەڕابوونەوە. میر ئیڤانیش وا لێرە لەبەر پێیان ڕاکشـابوو و دەستکەوتەکانیشی بە تەکیەوە بوون. بڕیاریان دا بیکوژن و دەستکەوتەکانی ببەن.

میـر ئیڤـانیـان کوشت، پەلینای مـەزەداریان هـەڵدایە سـەر پشتی ئەسپەکە و هێـلانە زێڕینـەکە و مـەلەکـەشیـان هەڵگرت و بەرەو مـاڵ ڕۆیشتن. گـەفـیـان لە شـازادە کرد ئەگەر بێتـو ورتەی لەزار بێتـە دەر ئەوا بە دەردەکەی میر ئیڤـانی دەبەن.

میـر ئیڤان لەوێ لـەسـەر گیـا کـەوتبوو. سیـسـارکە کـەچەڵیش بە ئاسـمـاندا دەخـولانەوە. لە نـاکـاو گـورگـە بۆر پەیدا بوو، پڕی دایە بێـچـووە سـیـسـارکـە کـەچەڵێک و ڕفـاندیـە لای دایکی و گـوتی: (دایکێ بڕۆ هـەندێک ئـاوی ژیان و مردنم بۆ بێنە. هەرکاتێ هێنات بێچووەکەت دەدەمەوە.)

دایکە سیـسـارک هەڵفڕی و دوای تاوێک ئاوی ژیان و مـردنی هـێنـا. گورگە بۆر هەندێک ئاوی مـردنـی پرژاندە سـەر برینـەکـانی مـیـر ئیـڤان و دەمـودەست برینەکانی سارێژ بوونەوە. پاشان هەندێک ئاوی ژیانی پرژاندە سـەر میر ئیڤان





و چاوی پێ هەڵێنا.

میر ئیڤان سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد و گوتی: (خەوێکی چاکم لێ کەوتبوو.)

گورگە بۆر گوتی: (چاک وا چاک! ئەگەر نەهاتبایەم جارێکی تر بەئاگا نەدەهاتییەوە، برایە دڵسۆزەکانت تۆیان کوشت و دەستکەوتەکانیان بردیت و بەرەو قەڵای باوکت هاژوایان. ئەگەر دەتەوێ زوو فریاکەوین، خێرابە خۆت هەڵدە سەرپشتم.)

دوای تاوێک گەیشتنە برایەکانی میر ئیڤان. گورگە بۆر پەلاماری دان و کەل و کۆمی کردن و پارچەکانی بەناو زەویوزاردا بڵاوکردنەوە. میر ئیڤان سەری ڕێز و ماڵئاواییی بۆ گورگە بۆر دانواند.

میر ئیڤان بە سواری ئەسپی یاڵ و بژ زێڕین گەڕایەوە ماڵ. یەلینای مەزەداری هاوێشتبووە پاشکۆی ئەسپەکەی، مەلی ئاگرین و هێلانە زێڕینەکەیشی بە دیاری بۆ باوکی هێنابوو. بەرەندەی پاشا دڵی بەم دیارییانە کرایەوە. میر ئیڤان هەموو شتێکی دەربارەی دەردەسەریی ڕێگە و گورگە بۆر و برایەکانی بۆ باوکی گێڕایەوە. چۆن کاتی میر ئیڤانیان لە خەوێدا کوشت و، چۆن گورگە بۆر بەهانای گەیشت و تۆڵەی لێ کردنەوە و کەل وکۆمی کردن و پارچەکانی دانە دەم ڕەشەبا.

بەرەندەی پاشا تاوێک داما بەڵام هێندەی نەبرد کەیفی هاتەوە. میر ئیڤان، یەلینای مەزەداری لەخۆی مارەکرد و گواستیەوە. پاشی ئەوە گەلێک بەخۆشی و شادی ژیان.



